6

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان

# چیرۆکی فیلەکەی ئەبرەهە

نوزادی


هۆنراوەی

ڕیدار احمد

نیگار

مریم عبدالله


التفسير

چیرۆکی

# فیلەکەی ئەبرەهە

داڕشتنی
رێدار ئەحمەد

نیگار
مریەم عبدالله



ناوی کتێب بەکوردی: چیرۆکی فیلەکەی ئەبرەهە
دارشتنی: رێدار ئەحمەد
نیگار: مریەم عبدالله
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣١ك – ٢٠١٠ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٩ ) ساڵی ٢٠١٠ پێدراوە

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ١

أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٍ ٢

وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ٣

تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ٤

فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٍ مَّأۡكُولِۭ ٥

## تەفسیری سورەتەکە:

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

١) ئەدی نەتزانی خوا چۆن ئازاری ئەبرەهە، خاوەنی سوپای فیلی دا، کە ویستیان کەعبە بڕوخێنن؟ ئەوەبو خواش لەناوی بردن و دوای بڕین.
٢) ئەدی فێڵ و پلانی ئەوانی پوچەڵ نەکردەوەو، ڕەنج بە خەساری نەکردن و، تەکبیرەکانی ئەوانی بنبو نەکرد، کە ئــەوەی ئەوان کۆیـــان کردبـــۆوە، پەرتـــەوازەی کردو هەڵیوەشاندەوە، ئەوەی ئەوان ئامادەیان کردبوو، لەناوی برد.
٣) خوا جۆرە باڵندەیەکی لە ئاسمانەوە، لەشیوەی تیپ و پۆل و کۆمەڵی یەک لەدوای یەکی بۆ ناردن، دیارە لەبەر ترۆیی ئەوان و سوک و چروکیان، خوا ســـــەربازی بۆ نەناردن، کە لەناویان ببات..
٤) باڵنـــدەکان قوڕی وشک کراوەی وەک بەردیان لە ئاسمانەوە تێدەگرتن، کە هاویشـــتنەکە ئامانجی دەپێکاو هەڵەی نەدەکرد، کەواتە هەر خوایە ســـەربازی لە فریشتان و باڵندەو مرۆڤان هەیە.
٥) ئەوان وەک ئەو گەڵاو پەلکە وشک بوەوەیان لێهات، کە وردو خاش کرابێ و ئاژەڵ خواردبێتی، پاشان فڕێی دابێتە دەرەوە و ژێر پێی بخـــات، جا ئـــەوانیش لەســـەر زەوی، پەرش و بڵاو و پارچەپارچەکران، کە جەستەیان لەت لەت کراو کۆمەڵەکەیان پەرتەوازە کرا.



چیرۆکی ئەم جارەمان
باسی (فیل)ە لە قورئان
لەسەردەمانێکی زوو
ئەبرەهە ناوێ هەبوو
پاشایەکی ناودار بوو
لە یەمەن، زۆردار بوو
کەللە ڕەق و بێ بڕوا
ئازاری خەڵکی دەدا
گەل لەدەستی بێزار بوو
ژین لەگەڵیا ناچار بوو
دووربوو لە بەرنامەی خوا
ملی بە حەق نەدەدا





کاتێ کە دی ئەو خەڵکە
بۆ حەج دەڕۆنە مەککە
دڵ پەست و نیگەران بوو
ژینی لێ هەراسان بوو
سەری هێناو سەری برد
پیلانێکی بۆ سازکرد
وتی: دەبێ لەمەو دوا
حەج نەکرێ لە کەعبەدا
بۆیە لە شاری سەنعا
کەنیسەیەکی دانا
ناوی (قلیس)ی لێ نا
گشت پێویستی تیا دانا
بە هونەر و نەخشی جوان
کەنیسەی کرد ئاوەدان
بەڵکو لای خەڵک بەڕێز بێ
وەکو کەعبە پیرۆز بێ
تا واز لە کەعبە بێنن
دیاری بۆ لای ئەو بێنن
تا لەمەودوا هەموو کەس
ئەم دابنێن بە گەورەو بەس



ئەبرەهەی پیسی بەدناو
خۆی بە زل هاتە پێش چاو
عەرەب کە ئەوەیان بیست
ئەو سەرشۆڕییەیان نەویست
بۆیە یەکێکیان لێ هات
تا کەنیسەکە پیس کات
ئەبرەهە بەوەی زانی
کێچ کەوتە کەوڵ و گیانی
ئەمجا فەرمانی دەرکرد
سوپایان ئامادەکرد
تا کەعبە بڕوخێنن
شوێنەواری نەهێڵن



کەعبـــەش مـــاڵی خودایـــە
قیبلـــەی خـــاوەن بڕوایـــە
ئیـــبراهیم دروســـتی کـــرد
ئیـــسماعیل بەردەســـتی کـــرد
بـــۆ کـــاری خوداناســـی
پەرستـــشی کـــەن بەراســـتی
پـــیرۆز بـــووە لای هـــەموان
ئێـــستاش ئەبرەهـــەی زۆردار
وا پـــێچ ئـــەخوا وەکـــو مـــار
دەڵێ: دەبـــێ نـــــەمێنێ
خـــەڵکی واز لـــە حـــەج بێنـــێ



سوپای ئەبرەهە جوڵا
فیلی زۆریان لەگەڵا
جاران لەجەنگا وابوو
فیل پێشەنگی سوپا بوو
لە سەنعا چووە دەرێ
تاکو هێرشی بەرێ
ماڵی خوا بڕوخێنێ
خواپەرستی نەمێنێ



سوپا ڕێگای دوور دەبڕێ
بەرەو مەککەوا لەڕێ
لە ڕێ لە تائیف وەستان
تا مەککەیان دەن نیشان

پیاوێ خەڵکی ئەو ناوە
(ئەبا ڕوغال)ی ناوە
بێ دین، بێ عەقڵ و نەزان
وەک دەلیل کەوتە پێشیان
هات و چاوساغی کردن
بەرەو ڕووی مەککەی بردن

ئەو پیاوە ناشیرینە
کە شایانی نەفرینە
بۆ ڕوخانی ماڵی خوا
وەک هار کەوتە پێش سوپا
خوا توشی دەردێکی کرد
هەر لەو ڕێگایەدا مرد



دوای ئـــەوەی ســـوپای زۆردار
لا یـــان دایـــە قـــەراغ شـــار
دەســـتیان کـــرد بـــە تـــالآنی
رانـــی حوشـــتریان هـــانی
ئەبرەهـــەی زۆردار، نـــەفام
وەری گـــرت مـــاڵی حـــەرام

ئەبرەهـــە لـــەنێو ســـوپا
سوارچـــاکێکی دەرهێنـــا
بەنوێنـــەر ناردی بـــۆ نـــاو شـــار
تـــا بیـــان کـــا ئاگـــادار
نوێنـــەر خێـــرا کەوتـــە ڕێ
تـــا نامـــەی پاشـــای بـــەرێ
کاتـــێ گەیـــشتە نـــاو شـــار
پرســـی: لـــە کوێیـــە ســـەرکار
وتیـــان: گـــەورەی ئـــەم شـــارە
پیـــاوێکی زۆر دیـــارە
نـــاوی ( عەبدولموتەلیب )ە
خانـــەدان و نەجیبـــە



نوێنــەر ڕۆیــشت گەشــتە جێــی
نامـــەی ئەبرەهـــەی دا پێـــی
وتــی: ئــەی گــەورەی دانــا
فەرمانـــە کـــە هـــەر ئێـــستا
بێیـــت و ســـەردانمان بکـــەی
تـــا لـــە مەبەســـتمان بگـــەی
( عەبدولموتـــەلیب ) ڕۆیـــشت
تـــا بـــە ئەبرەهـــە گەیـشت
ئەبرەهـــە چـــاوی پێـــی کـــەوت
بـــەرزی ئـــەوی بـــۆ دەرکـــەوت
بۆیـــە زۆر ڕێـــزی لـــێ نـــا
لـــەلای خۆیـــەوە دای نـــا
وتـــی: ئـــەی ســـەرگەورەی شـــار
ئـــەی پیـــاوی دانـــاو هوشـــیار
هـــاتوین کەعبـــە وێـــران کـــەین
دەســـت بـــۆ هیـــچی تـــر نابـــەین
لـــەجیاتی ئـــەو، لـــە ســـەنعا
لـــەو شـــارە جـــوان و بـــالا
بـــە نەخـــشە و هونـــەری جـــوان
( قلـــیس ) مـــان کـــرد ئـــاوەدان
تـــا خـــەڵک لـــەوێ حـــەج کـــەن
پـــەنا بـــۆ لای مـــن بـــەن



( عەبدولموتـــــەليب ) ی پـــير

پيـــاوی خـــاوەن عـــەقڵ و بـــير

كاتـــێ خەبـــەری زانـــی

هاتـــــە وەڵام بـــــەجوانی

وتـــی: ئـــەی گـــەورەی ســـوپا

شـــــەڕمان نـــاوێ لەگـــەڵتا

داوای مـــــن ئەوەيـــــە لات

فـــەرمان بكـــەی بـــە ســوپات

حوشـــــترەكان بێننـــــەوە بـــۆم

ئـــــيتر لـــــەلاتان دەڕۆم

ئەبرەهـــــە ســـــەيری لێ هـــات

هـــەر داوای حوشـــتر دەكـــات

بۆيـــــە خێـــرای لێـــی پرســـی

ئـــەی لـــە كەعبـــە ناترســـی؟

مـــن هـــاتووم دەيـــرووخێنم

بۆتـــــان هـــەڵ دەوەشـــێنم

نـــابينی خـــاوەن هێـــزم

كێيـــــە بێتـــــە پـــــەرێزم

زۆر بەخۆيـــــدا دەی نـــــازی

لـــــەخۆی زۆر بـــــوو رازی



ئـــەویش ڕوی تێکـــرد ئـــەمجا
وتـــی: ئـــەی خـــاوەن ســـوپا
کەعبـــە خـــوا خـــاوەنێتی
هـــەر خـــۆی پـــارێزەرێتی
خـــــاوەن زەوی و ئاسمانــــــە
ئـــەو بـــەدی هێنەرمانـــــە
کەعبـــە مـــاڵی خودایـــە
هـــەر خـــوداش بەتوانایـــە
بـــەرد و دار ناپەرســـــتین
هـــەر تـــەنها خـــوا ویـــستین
ئەبرەهـــە کـــە گـــوێی لـــێ گـــرت
تـــەواو تـــوڕەیی دای گـــرت
حوشـــــترەکانی پـــــێ داوە
ئـــــەویش گەڕایـــــە دواوە





دڵــی تــەنگ و لێــو بــەبار
بــانگی کــرد لــە خــەڵکی شــار
وتــی: ئــەی خــەڵکی بــەڕێز
ئەبرەهــە بــە ســوپا و هێــز
هــاتووە لــە ســەنعاوە
نیــازی گــەلێک خــراوە
خەریکــە هەڵمــەت دێنــێ
تــا کەعبــە بڕوخێنــێ
کەنیــسەی بنیــات نــاوە
خــەیاڵی وای هێنــاوە
نیــازی یــە بــچن لــە ســەنعا
بــۆ لای ئەبرەهــەی گــومڕا
بۆنــەو ســەردانەوێنن
حــەج لــەوێ بــەجێ بێــنن



ئێمـــەی خـــەڵکی ئـــەم شـــارە
بێهێـــزە، بـــێ توانـــاو چـــارە
بـــەرگریمان پـــێ نـــاکرێ
چـــاک وایـــە بکەوینـــە ڕێ
لەشـــار دەرچـــین بـــۆ چـــیا
تـــا خـــوا بگاتـــە فریـــا
مەگـــەر هـــەر تـــەنها خـــودا
ئـــــەم بەڵایـــــەمان لێ لادا
ســـوپای دوژمـــن بـــشکێنێ
توانـــا و هێـــزی نـــەمێنێ
کـــاتێ چـــونە ســـەر چـــیا
دەســـتی ســـکاڵا و نـــزا
لـــــەخودا پاڕانـــــەوە
بـــێ بـــە هانایانـــەوە
تـــا دوژمنـــان بـــشکێنێ
توانـــاو هێزیـــان نـــەمێنێ
خـــاوەن کەعبـــە خودایـــە
چـــارە لەدەســـت ئەودایـــە



ئەبرەهــــە فـــەرمانی کــــرد
ســـوپا جوڵـــەی دەســت پێکـــرد
بــــەڵام فیلــــی پــــێش ســــوپا
بــــەرەو رووی کەعبــــە نــــاڕوا
ئــــەژنۆیان نــــا ســــەر زەوی
شــفرەی بــەرزیان کــرد نــەوی
راکـــــشان وەکــــو مــــردوو
رووە و کەعبـــە فیـــل نەچـــوو
ســــوپا گـــشت واقـــی وڕمـــا
چ کارەســــاتێك قــــەوما؟!
رووی فیلیـــان گـــۆڕی بـــۆ شـــام
بـــــزانن چـــــۆنە ئـــــەنجام
فیـــل بـــۆی هەســـتا، زۆر خێـــرا
بـــە غـــار رۆیـــشت بـــە ڕێـــدا
بــــەرەو هــــەر لایــــەکی کــــە
دەڕۆی، بێجگــــە لــــە مەککــــە
بــــەس روەو کەعبــــە نــــاڕۆن
ئەبرەهـــەش رووی تـــاڵ و مـــۆن
بـێ ســـود بـــوو بـــانگ و دەنگـــی
دای پۆشـــی بـــوو دڵتـــەنگی



لــەناکاو چــەند مــەلێ جــوان
دەرکـــەوتن لـــەنێو ئاسمـــان
هاتـــە ئاســـت ســـەری ســـوپا
بەچـــرِی دەورەیـــــان دا
بـــەردیان بەردایـــە خـــوارێ
ســـــوپا بـــــەزی بـــــەجارێ
بـــەرد لـــە هەرکەســـی ئـــەدا
گۆشـــت و ئێـــسکی دەســـوتا
ســـوپا لـــەو جێگـــا چـــۆلا
تێکـــەڵ بـــوو لەگـــەڵ خـــۆلا



پادشا بە لوت شکاوی
بە زەلیلی و بەدناوی
ترس هەناوی بڕی
دەنگی ناڵەی هەڵبڕی
شڵەژاو حەپەسابوو
گۆشتی لاشەی رزابوو
لەگەڵ ئەوانەی مابوون
زوو هەڵهاتن و بۆی دەرچوون
بە هاوار و ناڵەناڵ
لەتاو دمرد و ژانی تاڵ
خۆی گەیاندەوە سەنعا
لەگەڵ پاشماوەی سوپا
بەو دەردە گیانی دەرچوو
هەردوو دنیای لەدەست چوو
ئەنجامی زاڵم وایە
سەرشۆڕی بەردەم خوایە




ئەو ساڵەی سوپا شکا
بەساڵی فیل ناونرا
هەر لەو ساڵەدا خودا
رەحمەتێکی دیاری دا
محەمەد لەدایك بوو
بۆ جیهانیان مژدە بوو
خوا کردی بە پێغەمبەر
رەحمەتە بۆ بونەوەر
بۆ شکانی بەرد و دار
بتی بێهێز، بێ کردار
بۆ خودا بە یەك ناسی
گرتنی رێگەی راستی
قورئانی نارد بۆ جیهان
رێ رۆشن کارە بۆمان
ملیۆنان حاجی ساڵان
لە سەرانسەری جیهان
دەچنە سەردان، ماڵی خوا
فەرزی حەج دەکەن ئەدا
کەعبەی روگەی موسڵمان
پیرۆزە لەلای هەمولن
ئەم چیرۆکە تەواو بوو
سودی تیایە بۆ هەموو

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ
فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم
بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾

